# تورەکە پڕ سێوەکە



نووسەر: ڤلادیمیر سوتاییڤ

لە ڕووسییەوە بۆ ئەلمانی: ه. ئەنگەرۆڤا، ز. زاگاس، ف. زێشنیتسەر، م. تۆلۆستۆڤا

لە ئەلمانییەوە بۆ کوردی: سەلام عەبدوڵا

**جارێکیان کەروێشکێک بۆ دارستان ڕۆیشت. تورەکەیەکی لەگەل خۆی برد و بۆ قارچك و تووی شرین گەڕا بۆ منداڵەکانی، بەڵام هیچی نەدۆزییەوە. لە دواییدا گەیشتە چیمەنی دارستانێکی گەورە و لە ناوەڕاستی سەوزەلانییەکەیدا دارە سێوێکی گەورەی بینی و سێوە سووری گەورەو ئاوداری پێبوو؛ لە خواریشییەوە بە دەورەوبەریدا، سێوێکی زۆر لەسەر ئەرزەکە کەوتبوو. کەروێشکەکە خێرا سێوەکانی کۆکردەوە و تورەکەکەی پڕ کرد.**
**لەولاوە قەلەڕەشکەیەك هات و لە سەر دارە سنەوبەرێك دانیشتەوە و وتی: قاق! قاق! پێیان وایە کەس نایانبینێ! هەموو کەسێك دەتوانێ بۆ ئێرە بێت، و هەموو سێوەکان بۆ خۆی ببات.**
**کەروێشکە پێی وت: لێ گەڕێ لە قاق و قیقەکانت، لێرە سێوێکی زۆر هەیە و بەشی هەموو دانیشتوانی دارستانەکە دەکات. منداڵەکانم لەماڵەوە، برسیانە.**
**کەروێشکە تا پێی کرا، تورەکەکەی تا سەری سەرەوە، پڕ کرد. بەڵێ، زۆر قورس بوو و ناکرێ هەڵبگیرێت.**



کەروێشکەکە بە هەزار حاڵ، تورەکەکەی بە سەر زەوییەکە ڕاکێشا. لە پڕێکدا بە سەرەوە سەری لە شتێکی تووکن دا؛ چاوی هەڵبڕی و تووشی ترسێکی سامناك بوو- لە بەرامبەریدا، ورچێك ڕاوەستابوو.



ورچەکە بە نەڕینەوە پێی وت: ئەوە تورەکەکەت چی تیایە؟
کەروێشکەکە، ئارام بووەوە و تورەکەکەی بۆ کردەوە.
سێوم هەیە...فەرموو لە خزمەتی بەڕێزتانە.
ورچەکە قەپاڵێك
لە سێوێك گرت
و نەڕاندی:
سێوەکانت
زۆر باشن
و دەبووژێنێتەوە.
و باوەشێکی
لێ هەڵگرت و کەوتە ڕێ.





کەروێشکەیش ڕێگاکەی گرتە بەر.

سمۆرە لە هەموو لایەکەوە بە بازدانەوە بۆ لای هاتن و بە دەنگە باریکەکەیانەوە هاواریان دەکرد: مام کەروێشك! مام کەروێشك! ئاخ، تکایە نەختێ سێومان بدەرێ!

هیچ ناکرێ، کەروێشکەکە دەبێ تورکەکەی بۆ سمۆرەکان بکاتەوە.



و هەر وا کەوتە ڕێ و ئەمجارەیان ڕووبەڕووی برادەرە کۆنەکەی بووەوە و پرسیارری لێ کرد: ئەوە بۆ کوێ دەڕۆی ئاژەڵە دڕکینەکە؟

ژیشکەکە وتی: بۆ قارچك دەگەڕێم، بەڵام ئەم ساڵ نەهاتە. بڕوانە سەبەتەکەم چەند بەتاڵە.

سێوم لێ وەربگرە، شەرم مەکە، زۆرم پێیە. کەروێشکەکە وای وت و سەبەتەی ژیشکەکەی بە سێو پڕ کرد.





ئەم جارەیان ڕێگاکە گەیشتە چیمەنێك. لەوێ کۆمەڵێ بزن یاریان دەکرد و لەلایەن دایکیانەوە چاودێری دەکران و کەروێشکەکە سێویان پێشکەش کرد.

ئێستا ئیتر کەروێشکەکە ئەوەندە ڕۆیشت، ئیتر ماندوو بوو و لەسەر گردێك دانیشت و دەیویست بحەسێتەوە لە پڕێکدا....



خاك هەڵکەنەکە وتی(زۆر سوپاستیشتان دەکەم) و لە ژێر زەوییەکە خۆی شاردەوە.

**بەڵام لە ماڵەوە، دەمێکە خێزانی باوکە کەروێشك، چاوەڕوانی گەڕانەوەی دەکەن. بۆ ئەوەی کاتەکەیان بەسەر ببەن، دایکەکە ئەفسایەکی بۆ منداڵە برسییەکانی گێڕایەوە.**



بەڵێ، لە پڕێکدا دەرگاکەیان کرایەوە و یەکسەر گۆمەڵێك سمۆرە بە سەبەتەیەکی پڕ لە گوێز، ڕاوەستابوون و یەکێکیان وتی: دایکم زۆر سەڵاوتان لێ دەکات و ئەمەی پێشکەش بە ئێوە کرد. نۆشی گیانتان بێت! و بۆی دەرپەڕین.

دایکەکە لەبەر خۆیەوە وتی: نەخێر، ئای لەم ئاجبایەتییە.



پاش ماوەیەکی کورت ژیشکەکە بۆ سەردان هات و سەبەتەیەکی پڕ لە قارچکی پێ بوو و پرسیاری کرد: پیاوی ماڵەکە لە ماڵەوەیە؟

لە وەڵامدا دایکی ماڵەکە وتی: نەخێر، ئێمڕۆ بەیانی زوو کەوتە ڕێ و هێشتا نەگەڕاوەتەوە. ژیشکەکە ماڵئاواییانی لێ کرد و سەبەتەکەیشی بۆیان بەجێهێشت.





**بزنی هاوسێشیان گژوگیا و پەرداخێکی گەورەی پڕ شیری بۆیان هێنا و بە دایکەکەی وت: ئەمانە بۆ منداڵەکانت.**



**ئەم ئاجبایەتییە کۆتایی پێ نەهات، لە پڕێکدا، جیرە لە درزی ژێرخانەکەوە بەرزبووەوە و سەری(خاك هەڵکەنە)ەکە لێوەوە دەرهات و پرسیاری کرد: بەڕێز کەروێشك لێرە دەژێ؟**

**دایکی ماڵەکە پێی وت: بەڵێ، لێرە دەژێ**

**خاك هەڵکەنە لە وەڵامدا وتی: کەواتە بە درووستی زەوییەکەم هەڵدڕی و چەندین جۆری میوەی هەڵدا بۆ سەرەوە: گەزەر، پەتاتە، کەرەوز و چەوەندەری سوور.**

**(سەلاوێکی پێ پایان بۆ کەروێشك) وای پێ وتن و لە ژێر زەمینەکە خۆی وون کرد.**



کەروێشکەکە هێشتا هەر لەسەرە ڕێگایە بەرەوماڵەوە.
قەلەڕەشکەکە بەدوایەوە دەڕۆیشت: قاق! قاق! تۆ هەموو سێوەکەت پێشکەش کرد، بەڵام هیچت بە من نەدا!
کەروێشکەکە گێژ بوو. دوا سێوی ناو تورکەکەی دەرکردو وتی: فەرموو، وەریگرە! ئەم سێوە جوانترینیانە! بە عافێتان بێت!







**قاق!قاق...من پێویستیم بە سێوی تۆ نییە و حەزی لێ ناکەم، بەڵام ئەمە ئەوپەڕیەتی! تورەکەیەکی بەتاڵ بۆ منداڵە برسییەکانت دەبەیتەوە!**

**کەروێشکەکە: بەڵێ، من...من ئێستا بۆ ناو دارستانەکە دەگەڕێمەوەو تورەکەیەکی تری سێو دەهێنمەوە.**



بۆ کوێ دەچیت ئەی نەگبەت؟ بڕوانە چ هەورە ڕەشیك، بەڕێگەوەیە.
بەڵام کەروێشکەکە تا هێزی تێدا بوو، بە ڕاکرتن بەرەو دارستانەکە ڕۆیشت.
هەر کە گەیشتە دارە سێوەکە....



**گورگەکە، کەروێشکەکەی بینی و، لیکاو دەمی هاتەخوارەوەو پرسیاری لێ کرد:**
**ئەوە تۆ چی دەکەی لێرە؟**

**من...من دەمویست سێو بۆ منداڵەکانم ببەمەوە.**
**گورگ: تۆ زۆر حەز دەکەی لە سێو خواردن؟**
**کەروێشك: بەڵێ، زۆر حەز لە سێو خواردن دەکەم**
**(منیش زۆر حەز لە خواردنی کەروێشك دەکەم) گورگەکە وای وت و پەلاماری کەروێشکەکەی دا.**





کەچی، ئێستا تورەکەکە بە هانای کەروێشکەکە، هات.





شەو درەنگانێك بوو كاتێ كەروێشكەكە هێدی هێدی بەرەوماڵەوە گەڕایەوە.



**منداڵە تێربووەکانی لەناو خەوێکی قوڵدا بوون و تەنها دایکە کەروێشک خەوی لێ نەکەوت و بە بێ دەنگییەوە، فرمێسکی دەڕشت.**
**ئەوجا لە دەرگاکە درا....**



کەروێشکە بچکۆلانەکان لە حەوت خەوی شرینەوە بێداربوونەوە و هاواریان کرد: هورِا! هورِا! باوکمان گەڕایەوە!

دایکە کەروێشك دەرگاکەی کردەوە و دەبینیٚ باوکە کەروێشك لە سەریەوە تا بن پێی تەڕ بووە. ئەوجا بە هەناسەساردییەکەوە وتی: مندالە خۆشەویستەکانم، من هیچم بۆ خواردن نەهێناوەتەوە.

دایکە کەروێشکیش بە خەمبارییەکەوە وتی: ئاخ، کەروێشکە بیٚ چارەکەم.





لە پڕێکدا خانووەکەیان کەوتە لەرزین و دەنگە دەنگێگ هات.
ئەوە گورگەکەیە!خێراکەن، دەرگاکە دا بخەن! خۆتان بشارنەوە!
جیرەجیرِی شوشە، بەرزبووەوە و لە دوو تۆی پەنجەرەکەوە ورچێك بە کەلە زلەکەیەوە، سەری دەرهێنا و بە ناڕاندنەوە وتی.




فەرموون وەری بگرن، من ئەمەتان پێشکەش دەکەم. ئەمە هەنگوێنێکی زۆر باشە، هەنگوینی قەرەنگوێیە.



**لە ڕۆژی داهاتوو، خێزانی کەروێشك هەموویان بۆ نانی بەیانیان کۆبوونەوە. جا چ مێوەو خۆراکێکی بەلەزەت لەسەر مێزەکە نەبوو: قارچك، گوێز، چەوەندەر، تور و هەنگوین، پەتاتە و گەزەر.**

قەلەڕەشکە زیرەکەکە سەری زۆر سووڕما و تی: من تێناگەم چۆن لە تورەکەیەکی بەتاڵدا، ئەو هەموو شتە باشانەی لێ دەردەکرێن؟

